# ﴿ ئاكار و ڕەوشتی ئافرەتی باش و چاک ﴾

نوسینی

زانای پایە بەرز: عبدالرَّزاق بن عبد المحسن العباد البدر

وەرگێڕانی: ناصح حسن بیتوێنی

# پێشەکی

بێگومان ئافرەت گرنگیەکی تایبەتی هەیە لەدینی ئیسلامدا ، بەجۆرێک کە لەهیچ دین و شارستانیەکی کەدا ئەم گرنگیەی پێ نەدراوە ، سەرەڕای ئەوەش زوڵمی لێکراوە وەکو کۆیلەیەکیش مامەڵەی لەگەڵدا کراوە ، بەڵام لەدینی ئیسلامدا لەبچوکترین مافیش بێبەش نەکراوە ، ئەوەی جێگەی داخە سات بەسات لەژێر ڕۆشنایی مافی ئافرەتدا ، وە لەژێر ناونیشانی بریقەداردا ئەو سیفەت و ڕێکارەجوانانەی کە ئافرەت پێویستە تێیدا بێت لێیان دادەماڵن ، لە بەرگی حەیاو حیشمەت دەیان بەن بەرەو زۆنگاوی تاوان ، وە بەرەو سفوری و ناپۆشتەیی و کاری نابەجێیان دەبەن ، کە ئەمەش هۆکاری ئاشنانەبونی ئافرەتانە بە سیفاتە بەرزوو جوانەکانی دین ، کە پێویستە ئافرەتان هەڵگریان بن ، لەم ڕوانگەیەوە هەڵسام بە وەرگێڕانی کتێبی ﴿ **صفات المرأة الصالحة** ﴾ لەدانەی زانای بەڕێزو خۆشەویست : **الشيخ عبدالدرزاق بن عبد المحسن العباد البدر** .

لەبەر گرنگی بابەتەکە و دورکەوتەنەوەی ئافرەتانمان لە سیفاتە چاک و جوانەکان بەپێویستم زانی کە ئەم نامیلکەیە وەربگێڕم بۆ زمانی کوردی بۆ ئەوەی خوشکانی کورد زمان لێی بێ بەش نەبن خۆیان بڕازێننەوە بە سیفاتە جوان و بەرزەکانی ئیسلامەتی ...

داواکارم لەخوای گەورە بیکاتە مایەی سودگەیاندن بۆ خوشکانی کورد زومان ، بیکاتە تێشویەکی نەبڕاوە بۆ دوارۆژم ، ببێتە چرایەکی ڕۆشن کەرەوە بۆ ئەو خوشکانەی بەدوای ڕێگای هیدایەتدا وێڵن ...آمین

**وەرگێڕ : ناصح حسن بیتوێنی**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إن الحمد للّٰه نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ باللّٰه من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده اللّٰه فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ألا إله إلا اللّٰه وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله صلى اللّٰه وسلم عليه وعلى آله وصحبه أجمعين،

**أما بعد....**

بەڕاستی ناونیشانی ئەم نامیلکەیە بەناوی ﴿ **صیفاتەکانی ئافرەتی باش** ﴾ وشەکان تەنها تایبەت نیە بەو ئافرەتانەی کەوا بەنیازی شوو کردنن دەیەوێت صیفاتی ئافرەتی باش بزانێت ، بۆ ئەوەی خۆی پێ بڕازێنێتەوە وە هەڵگری ئەم ئاکارو ڕەوشتانە بێت وە لەخۆیدا بنوێنێت ، پەرەیان پێ بدات ....

وە تایبەتیش نیە تەنها بە ئافرەتێک کەوا شوی کردوە ، چۆتە ناو ژیانی هاوسەرگیری یەوە ، کەوا حەز بکات ئەم ئاکارو ڕەوشتانە لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا جێبەجێیان بکات ...

هەرەکو چۆن بەتەنها تایبەتیش نیە بەئافرەتێکەوە کەوا کەم تەرخەمە ، کەوا دەیەوێت کەم و کورتیەکانی چارەسەر بکات ، بۆ ئەوەی کەم و کورتیەکانی پڕبکاتەوە، ژیانی هاوسەرگیری خۆی پێ باش و چاک بکات ..

بەڵكو ئەم وشانە زۆر لەمە گشتگیرترن ، چونکە بەڕاستی ئەمە بیرخستنەوەی ئەو باوكەیە كەوا دەیەوێت كچەكانی ژیانێكی خۆش ببەنە سەرو بچنە ناو پڕۆسەیەكی سەركەوتوی هاوسەرگیری یەوە ، لەسەر ئەو بنچینەو بنەمایانەی كەوا خوای گەورە دای ناوە ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردووە ، تاكو بیرخستنەوەو یارمەتی دەرێک بێت ، بۆ جێبەجێ كردنی ئەو صیفاتە شەرعیانە ، لەمیانەی یاساو ڕێسا شەرعیەكان كەوا كچ پێویستە لەسەریان گەورە ببێت و پەروەردە بكرێت ...

وە بیرخستنەوەیەكیش بێت بۆ دایک ، كەوا لەماڵدا ئەو ڕێنمونی كارو پەروەردەكارو بەرپرسە لە پەروەردەی كچەكانی ، كە زۆرێک لە ئافرەتان پەروەردە دەبن لەسەر زۆرێک لە ئاكارو ڕەوشتەكانی دایكیان ...

هەروەها بیرخستنەوەیەكیشە بۆ بانگخوازان تاكو گرنگی پێ بدەن ، بەگەورەیی سەیری بكەن ، بانگەوازی بكەن بۆ ئەو صیفات و ڕەوشتە جوان و بەرز و پیرۆزانە ، تاكو ئافرەتان و كچان هەڵگری ئەم ڕەوشتە جوانانە ببن ، لە چوارچێوەی ئیمانداریدا وە لەناو ئیماندارانداا ....

بەتایبەتیش كەوا ئێمە لەناو زەمەنێكدا دەژین كە ئافرەتانمان بەلاڕێدا براون ، بەرەو لاڕێبوونیان دەبەن كەوا لەهیچ كات و سەردەمێكدا ئەمە ڕوی نەداوە ، لە مێژوی ڕابوردویاندا ، لەڕێگەی گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوكراوەكان و كەناڵە ڕاگەیاندراوەكاندا ، وە

هەموو هۆکارە بەلاڕێدەرەکاندا ، کەئامانج لێی ڕامالّینی شەرم حەیاو ئیمان و شکۆ و ڕەوشت و گەورەیی ئافرەتە ..

بەڕاستی جاران ئافرەت نەدەگەیشت بە هۆکارە خراپ و بەلاڕێدەرەکاندا ، ئیلا لەڕێی کەناڵە زۆر نهێنی و تەسکەکاندا ، یاخود لەڕێگای هاوڕێی خراپ و هاوشێوەی ئەوە ، توشی خراپەو ڕەوشتی خراپ دەبوو  بەڵام ئەمڕۆ ئافرەت دەستی دەگات بەهەموو خراپەکاریەکانی دونیا ، هەموو شتە بێ ڕەوشت و بەلاڕێ دەرەکانی دونیادا لەکاتێکدا لە کونی ماڵەکەی خۆی دایە ، دەستی بەهەموو ئەمان دەگات ، بێ ئەوەی لەماڵەکەشی دەربچێت ...

ئافرەت دادەنیشێت بەرانبەر شاشەی تەلەفزیۆن یا لەڕێگەی ئینتەرنێت و بڵاوکراوە خراپەکان ، کە وردە وردە کار لە بیرو هۆش و دڵی دەکات، دەی گەیەنێت بەرەو خراپە و بەد ڕەوشتی ...

بۆیە ئافرەتی لەخواترس  پێویستە کەوا دیندارو چاک و خواناس بێت بۆ خوای گەورە ، وە خۆی دور بگرێت لە ڕێچکەو ڕێڕەوە خراپەکان

وە هەروەها بەرپرسیاریەتێکی گەورەی لەسەرە لەبەرانبەر ئەو کەسانەی کەوا لەژێر پەروەردەی ئەو دان ، کە ئەمەش شتێکی گەورەیە، پێویست دەکات گرنگی زۆری پێ بدرێت ، وە بە گرنگی سەیر بکرێت.

**دەڵێم:** لەژێر ڕۆشنایی ئەمەوە کە کەم تێ ڕامان و بیرکردنەوە ، وەکەمی باسکردن و خۆ ڕازاندنەوە بەم خو ڕەوشت و ئاکارە جوانە ئیمانیانە ، کە پێویست وایە ئافرەتان خۆیان بڕازێننەوە بەم خو ڕەوشتانە ، بەڵام بەداخەوە بێ شەرمی و کەم ئیمانی بڵاوبۆتەوە لەناو زۆرێک لە ئافرەتان ، بۆیە ئەبینیت زۆربەیان کەم تەرخەمن لە خواپەرستیاندا ، وە چەندین ڕێچکەو ڕێبازو ڕێگای نابەجێ و خراپ لەناویاندا بڵاوە ...

پاشان ئەمانە کۆمەڵێک صیفات و خو ڕەوشتی جوانن ، بۆ ئافرەتی خواناس و ئیمان دار داوا دەکەم لەخوای پەروەردگار کەوا یارمەتی دەرمان بێت ، ڕێ نموییمان بکات بۆ ڕێگای ڕاستی خۆی ، هەرشتێک ئەو بیەوێت و مەبەستی لەسەر بێت دێتە جێ ، هەرشتێکیش مەبەستی لەسەر نەبێت و نەیەوێت نابێت و نایەتە جێ ، هیچ گۆڕان و گۆڕان کاریەک دروست نابێت و نایەتە جێ ، ئیلا بە قودرەت و دەسەڵاتی خوا نەبێت...

لەم میانەوە داوا دەکەم لەخوای گەورەو میهرەبان و خاوەن عەرشی گەورەو فراوان ، کە پاداشتمان بداتەوە لەسەری ، سودی هەبێت بۆمان ، وە بیکاتە کلیلی کردنەوەی دەرگاکانی خێر و داخستنی دەرگاکانی شەڕو خراپە ، وە بیکاتە ڕێنمونی کارو هیدایەتی دڵەکان ، وە بیکاتە پردی پەیوەندیەک لەنێوان خۆمان و خوای گەورەدا بۆ بەدەستهێنانی

ڕەزامەندی ئەو ، وە دورکەوتنەوە لەهەرشتێک کەوا پێی ناخۆشە دەبێتە هۆکاری تورە بونی خوای گەورە.

## پشت بەخوا دەڵێم : -

کاتێک باس لە صیفاتی ئافرەتی چاک دەکەین یا چاکە خوازی ، ئەوەیە کە پێویستە بنچینەیەک بزانین کە بریتی یە لە بناغەی ئەم بابەتە کە نابێت پشت گوێ بخرێت ، کە ئەساسی چاکەکاری و چاکە خوازیی یە ، ئەویش بریتی یە لەوەی کە چاکە و چاکە خوازی نایەتە جێ تەنها بە دوو شت نەبێت:

**یەکەم:** تەوفیق و ڕێنمونی خوای گەورە ، وە هیدایەت و یارمەتی و کار ئاسانی لە لایەن خواوە ، چونکە خوا هیدایەت دەرو ڕێنمونی کارە ، وە هەموو کارەکان بەدەستی ئەوە ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴾ الكهف: ١٧.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَـٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ يونس: ٢٥.

کەواتە هیدایەت بەدەستی خوایە ، وەچاکە خوازی و چاک بوون بەدەستی خوایە ، هەرشتێک ویستی لەسەر بێت دەبێت ، هەرشتێکیش ویستی لەسەر نەبێت نابێت وە نایەتەجێ ، وە هیچ گۆڕان و گۆڕان کاریەک نایەتە دی ئیلا بە هێزو و دەسەڵاتی خوای گەورە نەبێت .

شتێکی تر کەوا پێویستە بزاندرێت : هەوڵدان بۆ چاکەو چاکە خوازی ، وە پەیڕەو کردنی ڕێگاو ڕێچکەکانی چاکەو چاکە خوازی یە ...

پێغەمبەری خواش ﷺ ئەم دوو خاڵەی کۆکردۆتەوە لە فەرمایشتێکدا ، لەفەرمودەیەکی صەحیحدا فەرمویەتی: (( احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ )) رواه مسلم.

**واتای:** (( احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ )) بەدەست گرتن بەهۆکارە چاک و سود بەخشەکان، کە بەهۆیانەوە توشی چاکەو چاکە خوازی دەبیت ، دەت گەیەنێت بەرەو چاکەکاری .

(( وَاسْتَعِنْ بِاللهِ )) **واتا:** بەپشت بەستن بەخوای گەورە ، اعتماد کردنە سەری ، کە یارمەتیت بدات و ڕێنمونی کارت بێت ، پارێزراوو پێ چەسپاوت بکات بۆ هەموو کارێکی خێرو چاک بەردەوامت بکات لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی ، کە ئەمە کۆکەرەوەی

هەموو کارە چاکەکانەو هەموو ئەم صیفاتانەی کەباس دەکرێن پشت بەستوون بە ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز یاخود سوننەتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**وە بنەمایەکی تر کە زەرورە ئاگاداری بین ئەویش ئەوەیە:-**

سەرچاوەی چاکەو چاک خوازی و هیدایەت بریتی یە لە قورئان و سوننەت ، کە پێویستە لەسەر هەرکەسێک کە ڕێنمونی کارە یاخود چاکە خوازی دەوێت ، پشت ببەستێت بە قورئان و سوننەت ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾ الإسراء: ٩.

**واتا:** بێگومان ئەم قورئانە بۆمان ناردون ڕێگاو بەرنامەیەکی وا نیشانی خەڵکی دەدا، کە ڕاسترین بەرنامەو ڕێگایە. بەڵێ.. لە هەموو کات و ساتێکدا، وە بۆ هەرکەسێک ئامادەیی تێدابێت ئەم قورئانە ڕێ نیشاندەر بوەو دەرەنجامیش بۆتە سەرکردەی دونیا .

وە لەفەرمودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا فەرمویەتی: (( تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي )) رواه الحاكم من حديث أبي هريرة وصححه الباني في صحيح الجامع٢٩٣٧.

**واتا:** دوشتم لەناوتاندا جێ هێشتوە گومڕا نابن لەدوای ئەوان و [دەست پێ گرتنیان] ، کتێبەکەی خواو سوننەتەکانم .

لەسەر ئەم بنەمایە بابەتەکەی ئێمە باسکردنی صیفاتی ئافرەتی چاکە لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت ، جا هەر صیفەتێک بەستراوەتەوە بەئایەتێک یاخود سوننەتێک لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ .

**بنەمایەکی تری گرنگ:** کە بنەمای هەموو عیبادەتێکە ، وە هەموو چاکە کاریەک لەسەر ئەم بنەمایە بنیات دەندرێت ، ئەویش بریتی یە لەتەقوای خوای گەورەو لەخوا ترسان ، چونکە ئەمە بناغەی هەموو چاکەو عبادەتێک و خۆش بەختی دنیاو دوا ڕۆژە ، کە پێویستە لەسەر ئافرەتی مسوڵمان خۆی بڕازێنێتەوە بە ئاداب و ئاکاری شەرعی ، پەیوەست بێت بە صیفاتە بەرزو جوانەکان ، کە هۆکاری نزیک بونەوەن لەخوا ، پاداشتی پێ بەدەست دەهێنێت ، بەڵام بەکەم تەرخەم بوون تیایاندا دەبێتە هۆکاری نەمان و نەهێشتنی پاداشت لەلای خوا ، کە لەباسێکی سەربەخۆدا باسیان دەکەین إن شاءاللّٰه ...

یەکەم شت کەوا دەستی پێ بکەم لەسەر صیفاتی ئافرەتی چاک ئەوەیە کە خوای گەورە لەسورەتی [النساء] دا ئاماژەی کردوە بە صیفاتی ئافرەتی چاک:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾ النساء: ٣٤.

کە ئەم وشەیە بەشێکە لەئایەتێک کەوا کۆمەڵێک باسی گشتگیر لەخۆ دەگرێت ، وە کۆمەڵێک صیفاتی جوان پڕ نرخ و گەورەی تێداە ،بۆ ئافرەتی چاک و چاکە خواز ، بۆیە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕێنمونیمان دەکات کە ئافرەتی چاک و چاکە خواز **دوو صیفات** لەخۆ دەگرێت:

**صیفاتی یەکەم:** پەیوەستە بە پەیوەندەی نێوان ئافرەتی چاک و خوای گەورە .

**صیفاتی دووەم:** پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان خۆیی و پیاوەکەی .

جا پەیوەندی نێوان خۆی و خوا لەم وشەیەدا دەر دەکەوێت کە خوا دەفەرموێت:

﴿ قَٰنِتَٰتٌ ﴾ کەبریتی یە لە بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی و خواناسی ، وە پارێزگاری کردن لە عیبادەت ، بەردەوام بوون لەسەری ، گرینگی دان بەفەرێزەتەکانی ئیسلام ، واجباتەکانی دین ،پشتگوێ نەخستن و گوێ نەدان پێی ، کەهەموو ئەمانە دەکەونە ژێر ئەم ئایەتە کەخوا دەفەرموێت: ﴿ قَٰنِتَٰتٌ ﴾.

بەشێکی تر پەیوەستە بەم ئایەتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾ **واتا:** پارێزگاری بکات لە حەق و مافەکانی تایبەت بە پیاوەکەی ، بەتایبەتیش لەو کاتانەی کەوا پیاوەکەی ئاگاداری نیە، وە لەو کاتانەش کەوا لەلای پیاوەکەیەتی ، ماڵەکەی دەپارێزێت، [وە پارێزگاری لێ دەکات لە سەرجێی و کارەکانی پەیوەست بە سەرجێیی ، خیانەتی لێ ناکات ، حەق و مافەکانی بەزایەنادات ، سنورەکان نابەزێنێت ، کەم تەرخەم نیە لە ئاست واجباتەکان] ، بۆیە خوای گەورە وەصفیان دەکات بەم ئایەتە: ﴿ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلْغَيْبِ ﴾ ئەمەش دوای پشت بەستن بەخوای گەورەو پشتیوانی خوای گەورە دێتە جێ ، چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾ ،چونکە پاراستنی ئەم سنورانە بەهۆی لێزانین و دانایی کەسەکان نی یە بەڵکو بەهۆی  تەوفیق و یارمەتی خوای گەورەیە ، وە ئەو ئاسانکارە بۆ بەندەکانی ، لەیارمەتیاندایە ، کە ئەمەش ئاماژەمان بۆ دەکات کە کەمێک لەمەو پێش باسمان کرد کەهەموو کار ئاسانی یەک و پاراستنێک بەهۆی تەوفیقی خوای گەورەوەیە.

وە ئەم بڕگەیەی کە خوای گەورە دەفەرموێت تێیدا : ﴿ قَـٰنِتَـٰتٌ ﴾ کە ئەمە وا دەکات پارێزگاری بکات لە واجبەکانی دین و فەڕیزەتەکانی ئیسلام .

وە لەسەر ئەم بابەتە کۆمەڵێک فەرموودە هاتوە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ئیمامی أبو هورەیرە ڕیوایەتی کردوە فەرمویەتی: (( أن النبي ﷺ قال، إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا: ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ )). رواه ابن حبان في صحيحه و حسنه الألباني في صحيح الترغيب برقم : ١٩٣٢.

**واتا:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێک ئافرەت پێنج نوێژەکەی کرد ، وە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژو بوو ، وە دامێنی پاراست لەحەڕام ، وە گوێڕایەڵی پیاوەکەی کرد ، لەڕۆژی دوایدا پێی دەوترێت لەکام دەرگای هەشتەوە دەتەوێت بچۆ ژوور .

خۆش بەختی بۆ ئافرەتی موسڵمان بۆ ئەم مژدە گەورەیە بۆی ، وە ئەم خێرو چاکە زۆرە بۆی ، کە خوای گەورە پەیمانی پێ داوە ، کەئەم چوار خاڵە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت نەک هەردو دەستەکان بەڵکوو بە پەنجەکانی یەک دەست دەژمێردرێن ، ئەم چوار کارە ئەگەر ئافرەت جێبەجێیان بکات لە ڕۆژی دوایی پێی دەوترێت : (( ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ )).

**واتا:** بچۆ بەهەشتەوە لەکام دەرگایەی کە خۆت دەتەوێت .

بەسە بۆ ئافرەتی باش و ئامۆژگاری خواز کەوا ئەم چوار خاڵە لەخۆیدا جێبەجێ بکات وە گرنگیان پێ بدات ، وە بەردەوام بێت لەسەریان و خۆی ڕابهێنێت لەسەر ئەم کارانە ، پارێزگاری کاری نوێژەکانی و ڕۆژوەکانی بێت ، وە پارێزگاری لە پیاوەکەی بکات ، [مەبەست بەپارێزگاری کردنی پیاوەکەی ئەوەیە کەوا حەق و مافەکانی فەرامۆش نەکات، ڕێزی لێ بگرێت [ **وەرگێڕ** ].

بۆ ئەوەی ئەم پاداشتە پڕخێرە بەدەست بهێنێت ، چونکە پێی دەوترێت لەڕۆژی دوایدا: (( ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ )).

بەڕاستی بناغەی باشی و چاکێتی ئافرەت لە چاک کردن و بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان خۆی و خوا دایە ، وە لە نزیک بونەوە لەخواو بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی دایە ، چونکە ئەم باشی یەتی و بەردەوام بوونە نهێنی خۆش بەختی یەتی ، وە نهێنی ڕزگاربونی یەتی لەهەموو نارەحەتی یەکانی دونیاو دوا ڕۆژ ،وە نهێنی سەرکەوتنی یەتی لە گەڵ هاوسەرو ماڵ و منداڵیدا وە لەهەموو ژیانی دا ،کە ژیانێکی خۆش و پڕ خێرو بەرەکەتی دەبێت.

**کەواتە** هەرکەسێک دەیەوێت خۆش بەخت بێت و بەخۆش بەختی بژیێت ، یاخود خۆش بەختی و خۆش گوزەرانی دەوێت بۆ کچەکانی ، ئەوا پێویستە

منداڵەکانیان پەروەردە بکەن و ڕایان بهێنن لەسەر خواپەرستی و عیبادەت کردن ، وە پارێزگاری کردن و بەردەوام بوون لەسەر عیبادەت ، وە گرنگیان پێ بدەن لەسەر فەرزەتەکانی ئیسلام بەتایبەتیش نوێژەکان و بەڕۆژوو بونی مانگی ڕەمەزان ، وە دور کەوتنەوە لە هەر شتێک کەوا شەرەف و کەرامەت و ناموسی ئافرەت لەکەدار دەکات ، ئەمەش لەم بڕگەیەدا دەردەکەوێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (( وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا )) .

وە پاراستنی دامێنی ئافرەت کارێکە دەبێت باوکی کچە پێی هەڵبستێت بە ڕێگری کردن لەو هۆکارانەی کەوا دەی گەیەنێت بەرەو بەدڕەوشتی و خراپەکاری ، کە بەهۆی ئەم هۆکارانە وە شەڕو خراپە ڕووی لەئافرەت دەکات ، وە بەهۆی ئەمەوە دەی گەیەنێت بەرەو خراپەکاری خواپەنامان بدات .

ئەمەش کۆباسێکی گرنگە پێویستە لەسەر هەرکەسێک کە چاکە خوازی و خێری بۆ خۆی دەوێت خۆی ڕابهێنێت لەسەر خۆپاراستن و داوێن پاکی ؛ پارێزگاری کار بێت لەسەر خوا پەرستی و عیبادەت و نزیک بونەوە لەخوای گەورە بەوەی پێی ڕازیە لە قسەی باش و کردوەی چاک ، پاشان ئەگەر خوا پیاوێکی موناسبی بەنسیب کرد ئەوە دەبێت لەخوا بترسێت هەر لەسەرەتای هاوسەر گیریەکەیدا ، لێرەش کەوا شتێک پێویستە باسی لێ بکەم بریتی یە لە زێدەڕەوی و ئیسراف کردن لە سەرەتای زەواج و

شەو ڕۆژی یەکەمدا ، لە زێدەڕەوی کردن لە مەسروفات و کارەکانی پەیوەست بە زەواجدا ، کە کارێکی ترسناکەو زەرەری زۆرە ، زۆرێک لە ئافرەتان کاتێک کەوا کاتی شوکرنیان دێت، یاخود شوو دەکەن چاو لە هاو شێوەو هاوڕێکانیان دەکەن ، گرنگی دەدەن بە هاوڕێکانیان یاخود هاوشێوەکانیان ، دەڵێن فڵانەکەس ئاوای کرد ، یا لە مارە بڕینی فڵان کەسە ئەمە کرا !!! جا لەم ڕێگەوە ئیسراف و زێدەڕەویی ڕوو دەدات ، پارە بەهەدەر دەدرێت ، یاخود تاوان و سەرپێچی تێدا ئەنجام دەدرێت ، کە ئەمانەش دەبێتە هۆکاری کەمی خێرو بەرەکەت لەسەرەتاو کۆتایی زەواجدا .

بە جیاواز لەگەڵ زەواجێک کەوا ئیسراف و تاوان و سەرپێچی تێدا ناکرێت و دوردەکەونەوە لە خراپەو تاوان ، دوور دەکەونەوە لە بەهەدەردانی ماڵ ، کە خەرجی و مەسروفاتی زەواجەکە نە زۆرە نەکەم کە ئەمانەش هۆکاری بونی بەرەکەت و خێرن .

بۆیە لەفەرمودەی صەحیحدا هاتوە لە عوقبەی کوڕی عامرەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( خَيْرُ النِّكَاحِ أَيْسَرُهُ )) **واتا:** باشترین و پڕ خێرترین ئافرەت ، ئاسانترینیانە .

سنن أبي داود و بصحيحه الباني في الصحيحة برقم : ١٨٤٢

وه لەفەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: (( أَعْظَمُ النِّسَاءِ بَرَكَةً أَيْسَرُهُنَّ مُؤْنَةً )) **واتا:** باشترین و پڕخێر ترین ئافرەت ئەوەیە کەوا مارەیی و مەسرووفاتی کەم بێت .

أخرجه أحمد في مسند من حديث عائشة برقم ٢٥١٢٠.

**کەواتە:** خێرترین ئافرەت ئاسنکارو ئاسان ترینیانە .

کەواتە پێویستە لەسەر ئافرەت و دایکان و باوکان کەوا لەکاتی زەواج دا ئاسانکار بن ، خۆ بەکەم زان و خاکی بن وە خۆ بەگەورە زان نەبن ، نەرم و نیان و لەسەرخۆ بن ، ئیسراف و زیدەڕۆیی لە ژن و ژن خوازیدا نەکەن ، چونکە ئەمە کاری گەری هەیە لەسەر ژیانی ژن و مێردایەتی .

جا ئەگەر ئاسانی و ئاسانکاری کرا ئەمە یەکێکە لە گەورەترین هۆکاری بونی خێرو بەرەکەت و بەردەوام بونی خێر .

**پاشان لە صیفات و تایبەت مەندی ئافرەتی چاک ئەوەیە:** خۆی بپارێزێت لە شەیتانی نەفرەت لێکراو ، چونکە شەیتان کاری خراپەو فەسادی نانەوەیە ، لە مامەڵەو ڕەوشت و ژیانی هاوسەرگیری دا ، وە تێکدانی هەموو شتێک کەوا خێری تێدایە ، بۆیە لەهەموو ڕۆژێکدا سەرباز و دارو دەستەکانی بڵاو دەکاتەوە بۆ ئەوەی خراپەو خراپەکاری بڵاو کەنەوە .

باتێڕامانێک بکەین بۆ ئەم فەرمودەیە کەوا لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە ، لەجابری کوڕی عبداللّٰه دەفەرموێت :پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا فَيَقُولُ مَا صَنَعْتَ شَيْئًا قَالَ ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ قَالَ فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ نِعْمَ أَنْتَ )) مسلم ٥٠٢٣.

**واتا:** شەیطان عەرش و تەختەکەی  دەخاتە سەرئاو ، پاشان دارو دەستەکەی بڵاو دەکاتەوە بۆ خراپەو خراپەکاری  ، نزیکترین کەس لەشەیطان  ئەوەیە کە گەورەترین فیتنەو خراپە دروست دەکات  ، یەکێکیان کەوا دەگەڕێتەوە دەڵێن فڵان و فڵان تاوانم پێ کرد ، یەکێکی تر دێت دەڵێت وازم لێ نەهێنا تا کەسێکم لەگەڵ خێزانەکەی جیاکردەوە ، شەیطانی گەورە ئەمەیان لەخۆی نزیک دەکاتەوە ، پێی دەڵێت بەڵێ ئەوەی تۆ تەواوە .

ئیمامی أعمش دەفەرموێت:[فیلتزمە ] نزیکی دەکاتەوە لەخۆی ، لە باوەشی دەگرێت کاتێک ژن و پیاوێک لەیەکتر جیا دەکاتەوە.

پێویستە لێرەوە ئافرەتی چاک تێ بگات و بیربکاتەوە لەم شتە، هەم خۆی هەمیش پیاوەکەی بیربکەنەوەو ئەو ڕاستیەش بزانن کەوا شەیتان دەیان بینێت و ئەوان ئەو نابینن

، وە لەناو دەمارەکان و خوێندا دێت و دەڕوات ، توشی وەسوەسەو ڕاڕایی یان دەکات ، فێڵ دەکات و لەخشتەیان دەبات ... هەموو ئەمانە دەکات لەکاتێکدا تۆ نایان بینیت، توشی ڕاڕایی و دودڵیت دەکات تا دەت گەیەنێت بە خراپەکاری و دوژمنایەتی لە نێوان خۆت و هاوسەرەکەت دا ، بۆیە چەندین ڕێگا چارەو خۆپارێزی هەن بۆ دەربازبوون لەم شتانە .

بۆیە لەسوننەتدا هاتوە کە خۆت بپارێزیت لەم ڕێگا خراپانە ، لەکاتی چونە ماڵت لەکاتی چونە لای خێزان و خواردن و خواردنەوەدا ، وە لەکاتی توڕەبووندا ، لەهەموو کاتەکاندا پێویستە کە ڕێگاکانی خۆپارێزی بگریتە بەر لەشەیتان بۆ ئەوەی شەیتان نەیەتە ناو ژیانی هاوسەرگیری و ناوماڵ و منداڵەکەت ، بۆیە پێویستە کەوا خۆپارێزی بکات لە شەیتان بە کردنی زیکرەکان و خوێندنی قورئان وە ئەو دوعایانەی کەوا هاتوون لەسوننەتدا بۆ خۆ پاراستن لەشەیتان هەروەها بە پارێزگاری کردن لەخوا پەرستی و عیبادەت کردن .

کەواتە لە صیفاتی ئافرەتی چاک ئەوەیە کە خۆ پارێز بێت لە فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان لە وەسوەسەو ڕاڕایی و دڵەڕاوکێ کە دەی خاتە ناو دڵەوە کە بەهۆی ئەمەوە شیرازەی ماڵ تێک دەچێت و ژیان و شیرازەی هاوسەرگیری تێک دەدات.

چەندین ماڵ و خانەوادە هەبوون کە بەهۆی گوێڕایەڵی کردنی شەیتان لەیەک ترازان و تێک چوون ؟؟ بەهۆی شوێن کەوتنی شەیتانەوە ، خۆ ئەگەر پەنایان بگرتبا لەخوای

گەورە لەشەیتانی نەفرین لێکراو وە دور بکەوتبانەوە لە وەسوەسەو فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان هەرگیز جیابونەوە ڕوی نەدەدا ، وە شیرازەی ماڵ تێک نەدەچوو !!

چەندین ماڵ و خانەوادە بەهۆی گوێڕایەڵیان بۆ شەیطان تێک چوون و لەناو چوون ، کەئەم جۆرە شەیتانانە پلەیان بەرزە لەلای شەیتانی گەورەو نەفرین لێکراو لەکەسە هەرە نزیکەکانی شەیتانن ،بەهۆی تێکدانی شیرازەی خانەوادەکان و لێک ترازاندنی هاوسەرەکان لەیەکتری !!

بۆیە پێویستە لێرەوە بزانین کەوا ئەم دوژمنە سەرسەختەمان بناسین کەوا دەمان بینێت و ئێمە نای بینین کەسێکی لێزان و داناو خاوەن تەجروبەی زۆرە لەم کارانەدا ،بۆ نمونە کاتێک باسی تەجروبەی کۆمپانیایەک دەکرێت دەوترێت پەنجا ساڵ یا شەست ساڵ تەجروبەی هەیە ، بەڵام شەیطان لە تێکدان و خراپەکاری و شێواندنی شیرازەی ماڵ خاوەن تەجروبەی هەزارەها ساڵە!! چەندین خەڵکی لەژیاندا نەماون و لەژێر خۆڵن لەناو گۆڕەکانیاندان کە قوربانی دەستی شەیتان بوونە !! بەهۆی فێڵ و تەڵەکانی شەیتانەوە بووە.

بۆیە پێویستە کەوا مرۆڤی موسڵمان پارێزگاری کار بێت لە خۆیی و خاوو خێزان و ماڵ و منداڵی ، خۆی بەدور بگرێت و بپارێزێت لە شەیتانی نەفرین لێکراو.

* یەکێکی تر لە صیفاتی ئافرەتی باش ئەوەیە کە پیاوەکەی دڵخۆش بکات کاتێک پیاوەکەی دەگەڕێتەوە ماڵ یاخود دەی بینێت ، لە ڕوخساریدا لە پۆشاکیدا لە خو ڕەوشت و مامەڵەیدا وابکات پیاوەکەی دڵخۆش بێت پێی ، بەجۆرێک کەوا لە خزمەت پیاوەکەیدا بێت فەرمانەکانی جێبەجێ بکات ، گوێڕایەڵی بکات بەبێ ئەوەی خۆ بەگەورەزان بێت یاخود قسەی پیاوەکەی ڕەت بکاتەوە ، بیربکاتەوە لەم فەرمودەیە کەوا ئیمامی النسائی ریوایەتی کردوە لە السنن الكبرى دا کە أبو هورەیرە بۆمان ڕیوایەت دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا پێی وتراوە: **أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟** فەرمویەتی: **(( الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ، وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ ، وَلاَ تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ ))**. رواه أحمد والنسائي وحسنه الألباني.

**واتا:** کام ئافرەتە باش و چاکە ؟؟ ئەویش فەرموی: باشترین ئافرەت ئەوەیە کاتێک پیاوەکەی سەیری کرد دڵخۆش بێت ، وە کاتێک فەرمانێکی پێ کرد گوێ ڕایەڵی بێت و لانەدات و سەرپێچی نەکات لە ماڵی یاخود لە شتێکدا کەوا پێی ناخۆشە. ئەم صیفەت و خاسیەتە لەڕوی شکڵ و مەنزەرەوەیە کە گرنگی بەخۆی بدات لەماڵەوە ، لەبەردەم پیاوەکەیدا ڕێک و پوخت و جوان خۆی بنوێنێت ، وە هەڵسێت بەکردنی ئەوکرانەی کەوا پێی دەسپێرێت ، پێویستیەکانی پڕبکاتەوەو گرنگی تەواو بدات بەپیاوەکەی .

یەکێک لەو شتە خراپانەی ناو ئافرەتان بەداخەوە ئەوەیە زۆرێک لە ئافرەتان گرنگی بەجوانی و خۆڕازاندنەوەی خۆیان نادەن لە ماڵەوە ، تەنها ئەوکاتانە نەبێت کەوا دەچنە دەرەوە یا دەڕۆن بۆ بۆنەو کۆڕو کۆبونەوەیەک یا هاوشێوەی ئەوانە ، بەڵام ئەوەی کە تایبەتە بەمافی پیاوەکەی لەماڵەوەدا گرنگی هیچ نادات بەخۆی دەیبینیت بە پۆشاکێکی سادەو ئاسایی و قژێکی ئاڵۆز و بۆنێکی ناخۆشەوە لەماڵەوە دێت و دەچێت ، کە پیاوەکەی بەم جۆرە هیچ ڕەغبەت و حەزێکی بۆ ناڕوات ، لەکاتێکدا کاتێک دەڕواتە دەر بەو پەڕی ڕازاوەیی و جوانی و خۆڕازاندنەوەوە دەڕواتە دەر کە ئەم وا دەکات پیاوەکەی حەزو ڕەغبەتی لەسەر خێزانەکەی نەمێنێت ، ئەمە چ جۆرە ڕەغبەتێکی ئەم پیاوە دروست دەکات بەرانبەر ئەم خێزانەی کە لەماڵ بەم جۆرەیە بۆ دەرەوەش خۆی دەڕازێنێتەوە؟!! وە چ خۆشەویستیەک باڵ دەکێشێت بەسەریاندا لەکاتێکدا ئەمە مامەڵەی بێت لەگەڵ خێزانەکەیدا .

کە ئەمە بەڵگەی کەم حاڵی بونی ئافرەتە وە کەمی بیرکردنەوەیەتی لە بەدەست نە هێنانی ژیانێکی خۆشی هاوسەرگیری و هەوڵدان بۆ خۆشگوزەرانی و

بەدەست هێنانی پلەو پایەی بەرز بەهۆی کەم عەقڵی خۆیەوە لەبەرانبەر ئەو کارانەی دەیان کات.

ئەمە جگە لەوەش کەوا زۆرێک لە ئافرەتان گوێ ڕایەڵ نین بۆ پیاوەکانیان وە سەرپێچیان دەکەن ، وە زۆر توڕە دەبن و زۆر شەکوای حاڵیان دەکەن لە پیاوەکانیان ، زۆر بەگلەیی و گازندەن ، کەئەمە وا دەکات ژیانێکی ناخۆش و خراپیان هەبێت ، ژیانێکی پڕنەهامەتی و لێکترازاو کە وا دەکات ژیانی ناخۆش و ناڕەحەت بکات .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (( إِذَا قَدِمَ أَحَدُكُمْ لَيْلًا، فَلَا يَأْتِيَنَّ أَهْلَهُ طُرُوقًا، حَتَّى تَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ، وَتَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ )) رواه مسلم من حديث جابر.

**واتا:** ئەگەر یەکێک لە ئێوە لەسەفەرێکی دور بوو لەشەودا گەڕایەوە با لە ناکاو نەیەتە ماڵەوە ؛ تاکو خێزانی ئامادەکاری بکات چونکە لە ماڵ نەبووە ، قژی جوان و ڕێک و شانەبکات و موەکانی لابدات . [ ئەم فەرمودەیە بەمانای ئەوە دێت کە ئافرەت خۆی ئامادە بکات بۆ پیاوەکەی لەلادانی موەکانی و ڕێکخستن و شانەکردنی قژی ، وە بۆ ئەوەی ئافرەتەکە وا گومان نەبات کە پیاوەکەی گومانی خراپی لێدەکات و چاودێری دەکات ، بەڵام زانایان دەفەرمون ئەگەر ئافرەت پێش گەڕانەوەی پیاوەکەی ئاگاداری گەڕانەوەی پیاوەکەی بێت یاخود هەواڵی گەڕانەوەی بزانێت یا پێشتر ئاگادار کرابێتەوە لە گەڕانەوەی پیاوەکەی ئەوا دروستە پیاوەکەی بگەڕێتەوە ماڵەوە ئەگەرچی سەفەرەکەی دوریش بێت - واللّٰه أعلم - [ **وەرگێڕ** ].

بێگومان ئەمە پێویستی بە تێڕامانە کە ئافرەت پێویستە لەسەری گرنگی بەخۆی بدات لە هەموو ڕویەکەوە لە جل و بەرگی لە ڕەنگ و ڕوخساری و پاک و خاوێنی و خۆ ئامادەکردنی بۆ پیاوەکەی ، بەتایبەتیش ئەوکاتانەی کەوا پیاوەکەی لە دەرەوەیە یاخود لەسەفەرێکە ، بۆیە دەبێت ئامادەکاری بکات بۆ پیاوەکەی تەنانەت لە ڕێکخستن و تەرتیباتی ماڵەوەش ، هەر وەکو عائیشەی دایکی ئیمانداران ڕەزای خوای لێبێت فەرمویەتی: (( قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ وَقَدْ سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لِي عَلَى سَهْوَةٍ لِي فِيهَا تَمَاثِيلُ فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَتَكَهُ وَقَالَ: **أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ قَالَتْ فَجَعَلْنَاهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ** )) أخرجه البخاری و مسلم.

**واتا:** کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەفەر گەڕایەوە شتێکی دانابوو کە داپۆشرابوو بە پارچە قوماشێکی نەخشێندراو ، پەیکەرو وێنەی تێدابوو ، پێغەمبەری خوا کاتێک بینی تورە بوو لای دا ، فەرموی قورسترین سزا لەڕۆژی دواییدا بۆ ئەوکەسانەیە کەوا وێنە یا پەیکەر دەکێشن و خۆیان دەچوێنن بە خوای گەورە [چونکە وێنە کێشان و پەیکەر تاشین خۆ چواندنە بە خوای گەورە ، هەر خوای گەورە وێنە کێش و دروستکەری بەندەکانە هەر بۆیە نابێت شتانێک دروست بکرێن هاوشێوەی دروستکراوی خوابێت [ **وەرگێڕ** ]

عائیشە دەفەرموێت کردمان بە پارچەیەک یاخود دوو پارچە .

بۆچی عائیشە ئەم پەردەو پارچە قوماشەی دانا ؟؟ چونکە ویستی کاتێک پێغەمبەر ﷺ دەگەڕێتە ماڵەوەو دێتە ژورەوە شتانێکی تازەو جوان ببینێت ، دڵ خۆش بێت کاتێک دێتە ژورەوە .

وە سود لەم فەرمودەیە وەر دەگرێت کەواتە پێویستە لەسەر ئافرەت کەوا گرنگی بدات بە ماڵ و ڕێکخستنی ناوماڵ ، هەروەکو چۆن پێویستە کە گرنگی بەخۆی بدات بەجوانی و ڕێک و پێکی پێشوازی لە پیاوەکەی بکات ، هەموو ئەمانە لە صیفاتی ئافرەتی چاکن کەوا لەسوننەتی پێغەمبەردا هاتوون ﷺ هەروەها هاتوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەفەرمودەی ئەنەسی کوڕی مالیکدا رضي الله عنه کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِنِسَائِكُمْ فِي الْجَنَّةِ؟ قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: كُلُّ وَدُودٍ وَلُودٍ إِذَا غَضِبَتْ أَوْ أُسِيءَ إِلَيْهَا قَالَتْ: هَذِهِ يَدِي فِي يَدِكَ، لَا أَكْتَحِلُ بِغَمْضٍ حَتَّى تَرْضَى )) رواه الطبراني وقال الالباني حسن صحيح.

**واتا:** فەرموی ئایا پێتان بڵێم بە ئافرەتەکانتان لە بەهەشتدا چۆنن ؟ ئێمەش وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرموی هەموو ئافرەتێکی خۆشەویست و خاوەن منداڵ کاتێک پیاوەکەی تورە دەبێت یاخود تورەی دەکات یا خراپەیەک ئەنجام دەدات بەرانبەری ، دەڵێت: بە پیاوەکەی ئەوە دەستم لەناو دەستت و کۆڵ نادەم ، تاکو ڕازی نەبیت لێم ، چاوم ناخەمە سەریەک و ناخەوم تاکو ئاش نەبیتەوە .

کەواتە ئەمە حاڵی ئافرەتێکە کەوا شایستەی چونە بەهەشتە کە هەڵگری ئەم ڕەوشتە بەرزەیە، هەر ئەمەش وا دەکات کە بچێتە بەهەشتەوە.

بەڵام جێگەی داخە کەوا ئافرەتانێک بەلایانەوە ئاسای یە کە پیاوەکانیان شەوێک یا دوو شەو یا زیاتر یا مانگێک بخەون بەتوڕەیی لەخێزانەکانیان، وەکو ئەوەی ئەم بابەتە بەلایەوە گرنگ نەبێت یاخود ڕۆژێک لە ڕۆژان ناگەڕێتەوە لای خوای گەورە ، وە لێپرسینەوەی لێ ناکرێت لەسەر ئەم کارو کردەوانە .

* وە لە صیفاتە چاکەکانی تری ئافرەتی چاک ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمودەیەدا ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێت: (( خَيْرُ نِسَائِكُمُ الْوَدُودُ الْوَلُودُ، الْمُوَاتِيَةُ الْمُوَاسِيَةُ إِذَا اتَّقَيْنَ اللهَ، وَشَرُّ نِسَائِكُمُ الْمُتَبَرِّجَاتُ الْمُتَخَيِّلاَتُ، وَهُنَّ الْمُنَافِقَاتُ، لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْهُنَّ إِلاَّ مِثْلُ الْغُرَابِ الْأَعْصَمِ )) رواه البيهقي و حسنه الباني في الصحيحة.

**واتا:** باشترین و چاکترین ئافرەتانتان ئەوانەن کە خۆشەویستن و منداڵ و وەچە دەنێتەوە ، قسە ڕەق و تەبیعەت توند نین ، شان بەشانی پیاوەکانیان دەوەستن لەیارمەتیان دان لەخواترسن و تەقوایان هەیە ، وە خراپترین ئافرەتانتان ئەوانەن کە سفورو ناپۆشتەن، پۆشاکە کانیان ناشەرعین ، ئەم جۆرە ئافرەتانە ناچنە بەهەشت ، ئیلا بەوێنەی قەلە

ڕەشی باڵ و قاچ سپی نەبێت [قەلە ڕەش بەوە ناسراوە کە تەنها ڕەنگی ڕەشە زۆر کەمن ئەوانەی کە باڵ و قاچیان سپی یە ، کەواتە چونە بەهەشتی ئەوانەش زۆر کەمن وەکوو چۆن بوونی قەلە ڕەشێکی باڵ و قاچ سپی لەناو قەلە ڕەشەکاندا زۆر کەمە ]

**تێبینی /** مەبەست لێرەدا کە دەفەرموێت ناچنە بەهەشت واتا لەسەرەتاوە ناچنە بەهەشت ، تاکو سزاو ئازاری ئەو سفوریی و بێ فەرمانی خوایەی ، کە کردویانە نەی چێژن ، دەچنە دۆزەخ بەڵام نەک بۆ هەتا هەتایی بەمەرجێک ئەو کەسە موسڵمان بوو بێت [ **وەرگێڕ** ].

بڕوانە ئەم کۆمەڵە صیفاتانەی ئافرەتی باش کە بریتی بوون لە: ( الـوَدُود ) ، ئەمە صیفاتێکی جوان و باشی ئافرەتی چاکی پڕ خێرو بە بەرەکەتە ، کە ( الـوَدُود ) بێت ، **واتا:** خۆشەویست و ڕوح سوک بێت ، باشترین کەسیش کە خۆشەویستی بۆ دەر ببڕیت نەرم و نیان بی بۆی پیاوەکەی خۆتە ، بە جۆرێک لەگەڵی باش بیت خۆشەویستی بۆ بنوێنیت خۆشت بوێت ، دڵی ڕابگریت، میزاجی تێک نەدەیت ، بە بەکارهێنانی قسەی شیاوو جوان و چاک، وە لە مامەڵەو پۆشاک و ڕوکاڵ دا جوان و ڕازاوە بیت مامەڵەیەکی جوان و چاکی لەگەڵ دا بکەیت.

وە ( الـوَلُـود ) بیت **واتا:** منداڵ و وەچەی زۆری بۆ بنێیتەوە ، ئافرەتێک بێت منالْت ببێت ، کە ئەمەش صیفاتێکی جوانی ئافرەتی چاکە، بەڵام ئەگەر ئافرەتێک تاقی

کرابووەوە بەوەی کە منالّی نابێت یاخود توشی نەخۆشیەک هاتووە دەسەڵاتی ئەوی تێدا نیە کە مندالّی نابێت بێگومان ئەو تاوان بارنابێت و هیچی لەسەر نی یە ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە چاک و لەخوا ترس نی یە وە خوای گەورە لەسەر ئەمە لێ پرسینەوەی لەگەڵ دا ناکات.

بەڵام ئەگەر کەسێک بێت کە مندالّی ببێت و هیچ کێشەی نەبێت خۆی ڕێگری بکات لە مندالّ بوون ، هەولّ دەدات مندالّی نەبێت ، لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ))

أخرجه أحمد و صححه الباني .

**واتا:** ئافرەتانی خۆشەویست و مامەڵە جوان و قسە نەرم و نیان بهێنن ، وە ئەوانەش کەوا مندالّیان دەبێت چونکە زۆرترین ڕێژەی شوێنکەوتوانم هەیە لەڕۆژی دوایدا تاکو ڕێژەی شوێنکەوتوانم زیاتر ببێت.

کەواتە پێویستە لەسەر ئافرەت کە هەولّی نانەوەی وەچەو مندالّ بدات ، هۆکارەکانی نانەوەی مندالّ بگرێتە بەر، وە هەولّی جوان پەروەردە کردنیان بدات ، هەست بەوە بکات ئەگەر بێت و مندالّی چاک پەروەردە بکات ئەوا کۆمەڵگەیەکی چاکی پەروەردە کردووە ، ئەمەش دەبێت هەر لەسەرەتای زەواجەوە هەست بەمە بکرێت ئافرەت بەم جۆرە بڕوانێتە ئەم بابەتە ، لە نێوان خۆی و خوادا بڵێت: بەڵکو خوای گەورە مندالّی

چاکم پێ ببەخشێت کە لە دوا ڕۆژدا منداڵەکانم لەخواترس و بۆ خوا صوڵحاو بن ، بانگ خوازو ڕێنمویی کار ببن ، بەهۆی ئەم ڕازو نیەتە چاکەوە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت ، کە چاودێری و پەروەردەی جوانی منداڵەکانی دەکات بەجوانی .

( **الْمُوَاتِيَةُ** ) **واتا:** ئەو ئافرەتەی کەوا دڵ ڕەق و قسە وشک و تەبیعەت ناخۆش نی یە ، گوێگرو گوێ ڕایەڵە ، قسە جوان و ڕێک و پێکە ، کەسێکی خۆ بەگەورە زان و توند و ڕەق نی یە، مامەڵە خۆش و نەرم ونیانە .

( **الْمُوَاسِيَةُ** ) واتا : ئەو ئافرەتەی کە دڵ نەوایی پیاوەکەی دەکات ، شان بەشانی و لەپشتی دەبێت و پشتی بەر نادات، بەجۆرێک یارمەتی دەریەتی لە چاکەو خواپەرستیدا ، وە لەهەر شتێک کە خۆشی و خۆش گوزەرانی دونیاو دوا ڕۆژی تێدایە بۆ پیاوەکەی.

( **إِذَا اتَّقَيْنَ اللهَ** ) **واتا:** بەهۆی ئەو صیفاتانەی کە باسمان کرد ، لەخوا ترس و بۆ خوا صوڵحاون ، کەسانێکی خۆشەویستن ، طەبیعەت و مامەڵە خۆشن ، قسە ڕەق و بێزار کەر نین ، منداڵ و وەچە دەنێنەوە ، ئەمانە خاسیەتی ئافرەتی چاک و لەخوا ترسە.

( **وَشَرُّ نِسَائِكُمُ الْمُتَبَرِّجَاتُ** ) **واتا:** خراپترین ئافرەتانتان ئەوانەن کە ناپۆشتەو سافیرەن ،کە بەپۆشاکی ناشەرعی و نادروست و بۆن خۆشەوە دەچنە دەر، بەجۆرێک کە شەیتان پێشوازی لێ دەکات ، دەبێتە هۆکاری فەسادی و خراپەی ناو کۆمەڵگا.

جا ئەگەر ئافرەت بە سفوری و ناپۆشتەی یەوە بڕواتە دەر ئەوا دەبێتە یەکێک لە کاربەدەستانی شەیتان، یارمەتی دەدات لە خراپەکاری و تاوان ، ئەمەش وا دەکات کە ئەوانەی کە ئیماندارن بەرەو تاوان و خراپەیان بەرێت.

( الْمُتَخَيِّلَاتُ ) ئەمە لە کبرو خۆ بە گەورە زانینەوەیە ، کە ئەمە پەیوەندی بە سفوری و خۆ بەگەورە زانینەوە هەیە ، چونکە ئەگەر ئافرەت بە ناپۆشتەیی و سفوری یەوە چووە دەرەوە وە خۆی بۆن خۆش کرد ، چوو بۆ بازاڕو کۆڵانەکان ، جگە لەوەش بەخۆ بە گەورە زانین خۆی دەبینێت ، سەرسامە بە خۆی و شکڵ و شێوەی ،کە ئەمەش پەیوەندیەک هەیە لەنێوان سفوری و خۆ بەگەورە زانین ، هەر وەکو چۆن پەیوەندی هەیە لەنێوان شەرم و حەیاو خۆ پۆشتەکردن ، حیجابی شەرعی ، هەر بۆیە ئافرەتی چاک و باش خاوەن حیشمەت و حەیایە ، وە دڵی پڕە لە شەرم و شکۆ، بەڵام ئافرەتی ناپۆشتەو سافیرە ئەوانەن کە پۆشاکی حەیا تێیان دا نەماوە ، بەڵکو پۆشاکی خۆ بەگەورە زانین و لوت بەرزی پۆشیوە ، کە ئەمە وا دەکات کە زەرەرو زیان بگەیەنێت بە ژیانی هاوسەرگیری ، بەڵکو هەموو ژیانی دەکاتە ناخۆشی و خراپەکاری ، هەر بۆیە ئەو ئافرەتانەی کە بەم جۆرە وەصفی کردن بە خراپترینی ئافرەتان.

فەرموی: (( وَشَرُّ نِسَائِكُمُ الْمُتَبَرِّجَاتُ الْمُتَخَيِّلَاتُ، وَهُنَّ الْمُنَافِقَاتُ، لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْهُنَّ إِلَّا مِثْلُ الْغُرَابِ الْأَعْصَمِ ))

( **الْغُرَابِ الْأَعْصَمِ** ) ناچنە بەهەشت بە وێنەی قەڵە ڕەشی قاچ و باڵ سپی نەبێت کە جۆرێکی زۆر کەمە چونکە قەلەڕەش هەمویان ڕەنگیان ڕەشە تەنها کەمێکی کەمیان نەبێت کە قاچ و باڵ سپین ، نمونەی ئەو ئافرەتانەش کەوا ناپۆشتەو سافیرەن ، خۆ بەگەورە زانن کە ئەوانە مونافیق و دووڕوون ناچنە بەهەشت هەروەکو نمونەی قەلە ڕەشی قاچ و باڵ سپی ، کە زۆر کەمن ئەوانەش کەوا هەڵگرێ ئەم صیفاتانەن کە لەم فەرمودەیەدا هاتووە ناچنە بەهەشت ئیلا کەمێکی کەمیان نەبێت ، وەصف کردنی پێغەمبەر خوا ﷺ چواندی بەم جۆرە قەلە ڕەشە کە ئەم جۆرە ، مانای ئەوەیە کە ئەم ئافرەتانەش ناچنە بەهەشتەوە کەمێکی کەمیان نەبێت.

بۆیە لەفەرموو دەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **(( يا مَعشَرَ النِّساءِ، تَصَدَّقنَ وأكثِرنَ الاستِغفارَ؛ فإِنِّي رأيتُكُنَّ أكثرَ أهلِ النّارِ ))** رواه البخاري و مسلم.

**واتا:** واتا ئەی گرۆی ئافرەتان خێرو صەدەقە بکەن ، وە زۆر داوای لێخۆش بوون لەخوا بکەن ، چونکە ئێوەم بینی زۆرینەتان دانیشتوان و ئەهلی ئاگر بوون.

بۆچی زۆرینەی ئافرەتان ئەهلی دۆزەخن؟ بۆچی زۆربەیان لەناو ئاگردان؟ چونکە کاتێک دەبینیت کە ئافرەتان زۆرینەیان هەڵگری صیفاتی خراپن ، بەجۆرێک کە زۆرینەیان

خاوەن خوو ڕەوشتی نەشیاون ، ئەو شتانەی کەوا قەدەغەیان لێکراوە ئەنجامی دەدەن ، بەجۆرێک هەر گرنگی پێ نادەن و ئەنجامی دەدەن ، وا نازانن کە ڕۆژێک دەگەڕێنەوە لای خوای گەورە ، یا موحاسەبەو لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێت ، لەکاتێک دا زانستیان پێ یە کە ئەم کارانە دروست نین و تاوان و قەدەغە کراون.

فەرمودەی زۆر هاتووە لەسەر کۆمەڵێک صیفاتی ناشیرین و نا بەجێی ئافرەتان کەوا وەصف کراون پێی ، هەر وەکوو لەفەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:

( لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ، وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ، وَالْمُسْتَوْشِمَةَ ) رواه البخاري و مسلم.

**واتا:** لەعنەتی خوا لەوانەی کەوا قژی دەست کرد بەکار دەهێنن ، ئەوانەش بۆیان بەکاردەهێنن ، وە لەعنەتی خوا لەوانەی کەوا خاڵ دەکوتن و ئەوانەش بۆیان دەکوتن .

وە لەفەرمودەیەکی تردا کە عبداللّٰه کوڕی عباس ڕیوایەتی کردوە: (( لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ )) رواه البخاري.

**واتا:** پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی کردووە لەو کەسانەی کەوا خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان ، وە لەو ئافرەتانەش کەخۆیان دەچوێنن بە پیاوان.

وە فەرمویەتی: (( لَعَنَ النبي والمُتَرَجِّلاتِ مِن النِّساءِ )) رواه البخاري.

**واتا:** نەفرەتی کردووە لەو کەسانەی کە خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

بەداخەوە هەرچەندە زۆرێک لە ئافرەتان هەڵگری ئەم صیفاتانەن کەوا هۆکاری لەعنەت و نەفرینی خودان ، بەڵام بەلایانەوە ئاسایی یەو گوێی پێ نادەن ، وە وا نازانن کە ڕۆژێک دێت دەوەستن لەبەرانبەر خوادا ، کە بەهۆیەوە دور دەبن لەڕەحمی خوای گەورە.

بیر ناکاتەوە کەوا ڕۆژێک لەڕۆژان دەخرێتە ناو گۆڕەوە خۆڵ دەکرێت بەسەری دا ، بەجۆرێک ڕەنگ و ڕووی تێک دەچێت ، کۆمەڵێک شت بەرەو ڕووی دەبێتەوە ، پێڵوی چاوەکانی دەکشێت بەسەر ڕوومەتی دا ، دەم چاوی چرچ و لۆچ دەبێت و نامێنێت .

چونکە کۆمەڵێک کارو کردەوە دەکات کە دەبێتە توڕەبونی خوای گەورە ، وە توڕەبونی خوای گەورە مسۆگەر دەکات ، کەواتە کۆمەڵێک خاسیەت و تایبەت مەندی هەیە دەربارەی ئافرەتی چاک کە لەسوننەتدا هاتووە ، وە فەرمان کراوە بە نەکردنیان، وە زانینی ئەم خاسیەتانە لەلایەن ئافرەتەوە کارێکی پێویست و گرنگە بۆ ئەوەی خۆی

بەدوور بگرێت لێیان ، وە وریای خۆی بێت لەکەوتنە ناویان هەروەکو شاعیرێک وتویەتی:

عَـرَفْـتُ الـشَّـرَّ لا للـشر **** ولـكـن لـتـوقِّـيـه

ومـن لا يعـــرف الــشرَّ **** مـن الناس يَقَعْ فـيهِ

* وەیەکێکی تر لە صیفاتەکانی ئافرەتی چاک بریتی یە لە کەم تەرخەم نەبوون لەحەق و مافەکانی پیاوەکەیدا ،وە هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پیاوەکەیی و خزمەت کردنی، وەبیر لەو فەرمودەیە بکاتەوە کەوا حوصینی کوڕی محصن لەپوریەوە کەوا ڕۆژێکیان هاتەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پێویستی یەک پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (( أَذَاتُ زَوْجٍ أَنْتِ ؟ )) **واتا:** ئایا تۆ خاوەن مێردیت؟ ئەویش وتی بەڵێ ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (( كَيْفَ أَنْتِ لَهُ ؟ )) ئایا چۆنیت بۆ ئەو؟ ئەویش وتی لەخزمەتی دام لەقسەی دەرناچم تەنها ئەوە نەبێت کەوا ناتوانم و لەتوانام دا نی یە ،ئەویش پێی فەرموو: (( فَانْظُرِي أَيْنَ أَنْتِ مِنْهُ ، فَإِنمَّا هُوَ جَنَّتُكِ وَنَارُكِ )) **واتا:** سەیرکەو بزانە تۆ چۆنیت بۆ ئەوە ، چونکە ئەو بەهەشت و دۆزەخی تۆیە.

**واتا:** ( باشبونت لەگەڵی هۆکاری چونە بەهەشتە ، خراپ بونیشت لەگەڵی هۆکاری چونە دۆزەختە ) رواه النسائي و صححه الباني.

چ کاتێک پیاو دەبێتە بەهەشت و دۆزەخ ؟ دەبێت ئافرەت لەم ڕاستی یە تێ بگات، وە لەم شتە گەورەیە تێ بگات کە پێی فەرموو : (( فَانْظُرِي أَيْنَ أَنْتِ مِنْهُ ، فَإِنَّمَا هُوَ جَنَّتُكِ وَنَارُكِ )) .

کەواتە پێویستە هەڵ بستیت بە ئەنجام دانی واجبەکان ، وە خوای گەورە فەرمانی پێت کردووە بە ئەنجام دانی واجبەکان و حەق و مافەکانی پیاوەکەت ،کەواتە هەڵ بستەو کارەکانی بەو پەڕی جوانی و ڕێک و پێکی ئەنجام بدە بێ کەم و کوڕتی و کەم تەرخەمی ، چونکە ئەمە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوایەو پەرستش و عیبادەتە بۆ خوای گەورەیە ، ڕەزامەندبونی خوایە ، بۆیە ئەوەی لەسەرتە و واجبە لەسەرت ئەنجامی بدە چونکە بەهەشت و دۆزەخی تۆیە ، وە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە.

* یەكێكی تر لە صیفاتی ئافرەتی چاك ئەوەیە كە زەخت ناخاتە سەر پیاوكەی لە نەفەقەو مەسروفاتدا ، وە زیادەڕۆیی و ئیسراف ناكات، ماڵی و سامانی پیاوەكەی بەهەدەر نادات بەڵكو داد پەروەرانە مامەڵە دەكات هەروەكو خوای گەورە فەرمویەتی: ئەو كەسانەی كاتێك كە نەفەقە بكەن ئەوە زیادەڕەوی ناكەن و سنوور نابەزێنن، یاخود لە تاواندا سەرفی ناكەن: ﴿ وَلَمْ يَقْتُرُوا ﴾ وە ڕەزیلی و چروكی و بەخیلی ناكەن: ﴿ وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا ﴾ الفرقان: ٦٧. بەڵكو لەو نێوانەدا مام ناوەند مەسرەف دەكەن.

وە با بیر لەو باسە بكەینەوە كە لە فەرمودەیەک دا هاتووە لە أبوسعیدی خودری و جابرەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێكی دا وتارەكەی درێژكردەوە باسی دنیاو ڕۆژی دوایی تێدا كرد وە باسی بەنو ئیسڕائیلی كردوو فەرموی: (( إنَّ أوَّلَ ما هلك بنو إسرائيلَ أنَّ امرأةَ الفقيرِ كانت تُكلِّفُه من الثِّيابِ أو الصِّيَغِ أو قال: من الصِّيغةِ ما تُكلِّفُ امرأةُ الغنيِّ ، فذكر امرأةً من بني إسرائيلَ كانت قصيرةً ، واتَّخذت رِجلَيْنِ من خشبٍ ، وخاتمًا له غلقٌ وطبقٌ، وحشته مِسكًا ، وخرجت بين امرأتَيْنِ طويليتَيْنِ أو جسيمتَيْنِ ، فبعثوا إنسانًا يتبعُهم ، فعرف الطويليتَيْنِ ولم يعرِفْ صاحبةَ الرِّجلَيْنِ من الخشبِ )). قال الألباني في "السلسلة الصحيحة" ٢ / ١٤٠: إسناده صحيح على شرط مسلم و قد أخرج في صحيحه ( ٧ / ٤٧ - ٤٨ ).

**واتا:** یەکەم شتێک کەوا بوە هۆکاری لەناو چونی بەنو ئیسرائیل [واتا: جولەکەکان ] ئەوەبوو کاتێک ئافرەتێکی فەقیرو هەژار ئەرکی دەخستە سەر پیاوەکەی لە کڕینی پۆشاک و شت و مەکدا ، یاخود فەرموی: ئەرکی دەخستە سەر پیاوەکەی لە شت و مەک دا چاوی لە ئافرەتە دەوڵەمەندەکان دەکرد ، پاشان باسی ئافرەتێکی بەنو ئیسرائیلی کرد کەوا کورتە باڵابوو ، ئەم ئافرەتە هەستا بەدروست کردنی دوو جوت نەعل لە تەختە [ بۆ ئەوەی لەپێیان بکات و باڵای بەرز دەربکەوێت ] وە موستیلەیەکی باش و پتەوی دروست کرد کە داپۆشەرێکی هەبوو، [ کە دەکرایەوەو دادەخرا ]، وە لەبەشی سەرەوە بە مسک بۆن خۆشی کردبوو ، پاشان چو بۆ دەرەوە لەگەڵ دوو ئافرەتی باڵا بەرزو قەڵەو ، خەڵکی کە ئەم دیمەنەیان بینی لەلایان نامۆ بوو کەسێکیان نارد بەشوێنیاندا، دوو ئافرەتە باڵا بەرزەکەیان ناسی بەڵام ئەو ئافرەتەی کە نەعلە تەختەکەی لەپێ کردبوو نەیان ناسی و بۆیان دەرنەکەوت کە کێ یە.

بۆیە یەکەم شتێک کە بەنو ئیسرائیلی لەناو برد ئەوەبوو ئافرەتێک پیاوەکە ژێربار دەکرد بۆ بەدەست خستنی زێڕو زیوو جوانیەکان و شت و مەک ، هەر وەکوو چۆن ئافرەتی دەوڵەمەند دەی کرد بە پیاوەکەی ، پاشان سەیری ئەم ئافرەتە باڵا کورتە بکە کە چی دەکرد لە مەسروفات و زیادەڕۆیی کردن بەفیڕۆ دانی ماڵ و فێڵ کردن کە چۆن ناڕازی بوو بەقەدەری خوا ، ڕازی نەبوو بەوەی کە خوا لەسەری نوسیبوو .

وە هەر شتێک بەوێنەی پێڵاوو نەعلی بەرز بێت دروست نی یە هەر وەکوو لە فەتوای دەستە گەورە زانایاندا تایبەت بە فەتوا هاتووە کە فەرمویانە: [ لەپێ کردنی پێڵاوو نەعلی بن بەرز دروست نیە ، چونکە هۆکارێکە بۆ بەربونەوە وە لەدینیشدا فەرمان کراوە بەخۆ بەدور گرتن لە هەر شتێک کەوا مەترسی هەیە هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ البقرة: ١٩٥.

**واتە:** بەدەستی خۆتان ، خۆتان تووشی بەهیلاك دان مەكەن ، وە ئەم ئافرەتە وا دەردەكەوێت كە باڵا بەرزەو كورت نیە كە ئەمەش فێڵ كردنە ، وە دەرخستنی جوانیەكە كە تێیدا نی یە.

* وە یەکێکی تر لە صیفاتی ئافرەتی چاک ئەوەیە کەوا کوفری ئەو کەسانە ناکات کە چاکە کارن بەسەریەوە وە سپڵە نی یە بەرانبەریان ، واتا سپڵەیی ناکات لەبەرانبەر پیاوەکەیدا کە خوا نازو نیعمەتێکی پێ دەدات لەڕێگەی پیاوەکەیەوە ، لەفەرمودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( لا يَشْكُرُ اللهَ مَن لا يَشْكُرُ النَّاسَ )) أخرجه أحمد وصححه الباني .

**واتا:** ئەوکەسە سوپاسی خوا ناکات کە سوپاسی خەڵک نەکات.

وەشتێک کەوا لەم کۆباسەدا هاتبێت ئەم فەرمودەیە کەوا بوخاری لـە کتێبی [ **الأدب مـفـرد** ] دا ڕیوایەتی کـردوە لـە ئەسـمـای کچی یەزیدی ئەنصاریەوە کـە فەرمـویەتی:

**(( إِيَّاكُنَّ وَكُفْرَ الْمُنْعِمِينَ،** فقلتُ: يا رسولَ اللهِ و ما كُفرُ المنَعَّمينَ ؟ قال: **لَعَلَّ إِحْدَاكُنَّ تَطُولُ أَيْمَتُهَا مِنْ أَبَوَيْهَا، ثم يرزقُها اللهُ زوجًا، و يرزقُها منه ولدًا، فتغضبُ الغَضبةَ فتَكفُرُ فتقولُ: مَا رأَيتُ مِنكَ خَيراً قَطُّ ))** رواه أحمد وصححه الألباني.

**واتا:** فەرموی وریابن کە کوفرانەو سپڵەیی دەرببڕن بەرانبەر ئەوانەی کە چاکەکارن بەسەرتانەوە ، منیش وتم ئەی نێردراوی خوا سپڵەیی بەرانبەر چاکە کارانەوە چی یە؟ فەرموی: یەکێ لە ئێوە لەلای دایک و باوکی ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوەو شوو کردنی دوادەکەوێت تا ئەوکاتەی خوای گەورە پیاوێکی بەنسیب دەکات ، لەم پیاوەش منداڵێکی پێ دەدات ، ئینجا لە پیاوەکەی تورە دەبێت [بەهۆی هۆکارێکەوە] کوفری نیعمەت دەکات و بە پیاوەکەی دەڵێت: هەرگیز هیچ خێرێکم لێت نەبینیوە .

بڕگەی **( تَطُولُ أَيْمَتُهَا مِنْ أَبَوَيْهَا )** **واتا:** شوکردنی دوا دەکەوێت .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **(( لَا يَنْظُرُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى امْرَأَةٍ لَا تَشْكُرُ لِزَوْجِهَا وَهِيَ لَا تَسْتَغْنِي عَنْهُ ))** رَوَاهُ الْبَزَّارُ بِإِسْنَادَيْنِ، وصححه الألباني.

**واتا:** خوای گەورە سەیری ئافرەتێک ناکات کەوا سوپاسی پیاوەکەی ناکات ، لەکاتێک دا بێ پێویست نیە لەپیاوەکەی.

* یەکێکی تر لە صیفاتی ئافرەتی چاک ئەوەیە کەوا ڕێزی پیاوەکەی دەگرێت و بەهاو نرخی پیاوەکەی دەزانێت ، کە ئەمەش چەندین فەرمودەی لەسەر هاتووە لەوانە فەرمودەی عبداللّٰه ی کوڕی عباس کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( لَا آمُـرُ أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ، وَلَـوْ أَمَرْتُ أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَـرْتُ الْمَـرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِـهَـا )) رواه الطبراني وصححه الباني.

**واتا:** فەرمان ناکەم کەوا کەس سوجدە بات بۆ کەس خۆ ئەگەر فەرمانم بکردایە بە کەسێک کەسوجدە بات بۆ کەسێک ئەوا فەرمانم دەکرد بە ژن کەوا سوجدە بات بۆ هاوسەرەکەی .

هەروەها لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاتووە کەوا موعاذی کوڕی جەبەل وتویەتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نابینیت کەوا ئەوانەی ئەهلی کیتابن [ **واتا:** جولەکەو گاورەکان ] سوجدە دەبەن بۆ قەشەو پیاوە ئاینی یەکانیان ، ئایا ئێمەش سوجدە نەبەین بۆ تۆ ؟ ئەویش فەرموی : (( لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا فَوَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تُؤَدِّى الْمَرْأَةُ حَقَّ رَبِّهَا عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى تُؤَدِّىَ حَقَّ زَوْجِهَا كُلِّهِ حَتَّى إِنْ لَوْ سَأَلَهَا نَفْسَهَا وَهِىَ عَلَى قَتَبٍ أَعْطَتْهُ )) رواه الطبراني وصححه : الألباني.

**واتا:** فەرمان ناکەم کەوا کەس سوجدە ببات بۆ کەس خۆ ئەگەر فەرمانم بکردایە بەکەسێک کەسوجدە ببات بۆ کەسێک ئەوا فەرمانم دەکرد بە ژن کەوا سوجدە ببات بۆ هاوسەرەکەی ، وە سوێند بەو کەسەی کەوا گیانی منی بەدەستە ، ئافرەت حەق و مافی خوا ناتوانێت بدات تا ئەوکاتەی هەموو حەق و مافی پیاوەکەی دەدات ، خۆ ئەگەر داوای سەرجێیی لێ بکات لەکاتێک دا کە کاتی مناڵ بونیەتی دەبێت بچێت بەدەم داواکاری پیاوەکەیەوە .

**واتا:** ئەگەر چەند سائێک پێش منداڵ بونی داوای لێ بکات کە مەبەست لێرەدا هاندانی ئافرەتە لە کەم تەرخەم نەبوون لە حەق و مافی پیاوەکەی لەکاری سەرجێی دا تاکو پیاوەکەی توشی زیناو خراپە نەبێت، ئەگەر نا ئافرەت کە منداڵی دەبێت تاکو چلەی دەڕوات یا پاک دەبێتەوە نابێت پیاو کاری سەرجێیی لەگەڵ بکات ] وەرگێڕ.

خۆ ئەگەر پیاوەکە کەسێکی دیندارو چاکە کارو لەخوا ترس بوو ، وابەستەی تەقواو دینداری و خواپەرستی بوو ئەوا حەق و مافەکانی زیاترە لەسەر ئافرەت ، [ وە تاوان بار تریشە لە پێشێل کردنی مافەکانی ].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (( لَا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا فِي الدُّنْيَا، إِلَّا قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنْ الْحُورِ الْعِينِ: لَا تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللهُ ، فَإِنمَّا هُوَ عِنْدَكَ دَخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا )) صححه الألباني في " صحيح الترمذي ".

**واتا:** هیچ ئافرەتێک نیە کەوا ئازاری پیاوەکەی دەدات لە دونیادا ئیلا خێزانی لە حۆریە چاوگەشەکان دەڵێت: ئازاری مەدە خوا لەناوت ببات ، ئەمە میوانە لەلات هەر کە جێی هێشتی و هاتە لامان.

زانایان فەرمویانە ئەمە هەڕەشەیەكی گەورەیە بۆ سەر ئەو ئافرەتانەی كەوا ئازاری پیاوەكانیان دەدەن .

* یەكێكی كە لە صیفاتی ئافرەتی باش ئەوەیە كە خوای گەورە منەتی كردووە بەسەری وە ڕێزی لێ گرت و منداڵی پێ بەخشی ئەوەیە كە داد پەروەر بێت لەنێوانیاندا ، هەروەكو پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (( اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُمْ، اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُم )) رواه أبو داود.

( **واتا:** دادپەروەر بن لەنێوان منداڵەكانتاندا ، دادپەروەر بن لەنێوان منداڵەكانتاندا ) ئەم بابەتە فەرمودەی زۆری لەسەر هاتووە .

* وە لە صیفاتی باشی ئافرەت ئەوەیە كەوا لەماڵەكەیدا بمێنێتەوە كەسێكی زۆر سەر بەدەر نەبێت ، بەردەوام بێت و بچێت ، وە كاتێک چو بۆ دەرەوە تەنها بۆ پێویستی بچێت بۆ دەرەوە ، وە دەبێت بە پۆشتەو حجابی شەرعیەوە بچێتە دەر نابێت سفورو ناپۆشتە بێت ، وە دەبێت چاوەكانی لە نەزەری حەڕام بپارێزێت ، دامێن پارێزراو بێت ، كە لەسەرەتادا بڕێک لەمانەمان باسكرد [زۆر بەداخەوە چونە دەری ئافرەتان زۆر زیاترە لە پیاوان لەكاتێكدا تەنانەت بۆ نوێژو خواپەرستیش ماڵەكانیان خێر ترە بۆیان چ جای چونە

دەر بۆ ئەم لاو ئەولای بازاڕەکان، ئەمە جگە لەوەی کە زۆربەی ئافرەتان پۆشاکەکانیان یا کورتە یا تەنکە یا تەسکە کەئەمەش یەکێکە لەتاوانە گەورەکان خوا ئاسانی بکات لە کتێبێکدا ئەو تاوانانە دەخەینە ڕوو کە زۆرێک لە ئافرەتان تێی کەوتون [**وەرگێڕ**].

وە لە ئەسمای کچی یەزیدەوە هاتوە کە لەلای پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە پیاوان و ئافرەتان لەلای دانیشتبوون ئەویش فەرمووی: (( **لَعَلَّ رَجُلًا يَقُولُ مَا يَفعَلُ بِأَهْلِه، وَلَعَلَّ امْرَأَةً تُخْبِرُ بِمَا فعَلَت مَعَ زَوجِها! فأَرَمَّ القَومُ** ، فقُلتُ: إي واللهِ يا رَسولَ الله، إنهُنَّ لَيَقُلْنَ، وإنَّهم لَيَفعَلونَ! قال: **فلا تفعَلوا؛ فإنَّما مَثَلُ ذلك مَثَلُ الشَّيطانِ لَقِيَ شَيطانةً في طَرِيقٍ فغَشِيَها والنَّاسُ يَنظُرونَ** )) رواه أحمد وصححه الباني .

**واتا:** پێ دەچێت پیاو ئەوە باس بکات کە لەگەڵ خێزانەکەی دەی کات [لە نهێنی و کاری سەرجێیی] وە ئافرەتیش بەهەمان شێوە ئەوە باس بکات کەوا پیاوەکەی لەگەڵی ئەنجامی دەدات، لەم کاتەدا خەڵکی هەموی بێدەنگ بوون ، منیش وتم : بەڵێ سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرموی : نمونەی ئەمە وەک شەیتانێکی وایە گەیشتبێت بەشەیتانێکی مێ لەڕێگادا جووت بن و کاری سەرجێیی بکەن ، خەڵکیش سەیریان بکەن .

ئەم وتەیە: **( إنهُنَّ لَيَقُلْنَ، وإنَّهم لَيَفعَلونَ )** کەوا ئەسماء وتی سەرەتا لە ئافرەتانەوە دەستی پێکرد کە ئەوان نهێنی و کارە تایبەتیەکانی نێوان خۆیان و پیاوەکانیان دەدرکێنن ، چونکە ئەمە لەناو ئافرەتاندا زۆرترە نەک پیاوان ، جا ئافرەت لەلای خوشکی یا هاوڕێ و دۆست و کەسوکاری باسی ئەم شتە تایبەت و نهێنیانە دەکات، وە زۆرێک لەم ئافرەتانە بەلایانەوە ئاسایی یە کە باس لەم شتانە بکەن.

ئەم وتەیەش کەوا دەفەرموێت: **( مَثَلُ الشَّيطانِ لَقِيَ شَيطانةً في طَريقٍ فغَشِيَها والنَّاسُ يَنظُرونَ )** **واتا:** ئەو ئافرەتەی کەوا بەم جۆرەیە ، وە ئەم پیاوەش کەوا بەم جۆرەیە ، نمونەیان وەکو دوو شەیتان وایە کە یەکێکیان بگات بەیەکێکیان و جووت ببن خەڵکیش سەیریان بکات .

## لەکۆتاییدا

ئەمانە کۆمەڵێک صیفاتی ئافرەتی باش بوون کەوا لە قورئان و سوننەت کۆم کردبونەوە داوا دەکەم لەخوای گەورە کەوا سود بگەیەنێت بۆ هەر کسێک کە خوا ویستی -هیدایەتی- لەسەر بێت ، وە داوا دەکەم لەخوای گەورە بۆ خاتری ناوە جوانەکانی و صیفاتە بەرزەکانی کە ڕێنمونیمان بکات بۆ ڕێگای ڕاست ، وە ئەوەی کە فێری دەبین بەڵگە بێت بەدەستمان لە ڕۆژی دوایدا نەک ببێتە بەڵگە لەسەرمان ، وە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە قسەو کردەوەکانمان وە بەرەکەت بخاتە کاتەکانمان و خۆمان و ماڵ و منداڵمان و خێزانمان ، وە بەرەکەت بخاتە ژیانمان بەگشتی دینمان پارێزراو بکات کەوا پارێزگارمانە ، دونیامان پارێزراو بکات کە جێگای ژیان و حەوانەوەمانە ، وە ئاخیرەتمان خێر بکات کە ڕێگای گەڕانەوەمانە ، ژیانمان ئەوەی ماوە لەدونیادا پڕی بکات لەخێر ، مردن بکاتە ئارام کەرەوەو دەرباز بوون لەهەموو شەڕو ناخۆشیەک ، وە ئافرەتان و کچانی موسڵمانان ڕێنمونی بکات بۆ چاکە ، بۆ ڕێگای ڕاست بەگەڕانەوەیەکی جوان و دروست ، وە لە هەموو فیتنە یەک و خراپەیەکی نادیار بیان گەڕێنێتەوە ، وە وامان لێ بکات کە هەموو خێرێکمان پێ خۆشەویست بێت ، هەر ئەو بیسەری تکاو پاڕانەوەکانە ، وە شایستەی تکاو داواکردنە ، هەر ئەو پارێزراو مان بێت - حسبي اللّٰه ونعم الوكيل-

**وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين ، وصلى الله وسلم وبارك ، وأنعم على عبده و رسوله و مصطفاه محمد بن عبدالله صلاوت الله وسلامه عليه وعلى آله و صحبه أجمعين.**